# بیرخستنەوەیەك لە

# چۆنێتی دەستنوێژ و نوێژی پێغەمبەر (ﷺ)

نووسینی
شێخ علي حسن علي عبد الحمید
وەرگێڕانی
مامۆستا عدنان بارام

## پێشەکی نووسەر :

شوکر و ستایشی بێ پایان بۆ پەروەردگاری هەموو جیهان ، و درووود و سەلامیش لە سەر سەروەری پێغەمبەران بێت ﷺ ، و ئەهل و بەیت و یار و یاوەرانی بەگشتی ، پاش ئەوەش :

**برای موسڵمان** : خوای پەروەردگار من و تۆش چاو ڕۆشنکات لە ئاینە پیرۆزەکەی ، ئەمەی کە لە بەردەستت دایە بیرخستنەوەیەکی فیقهی‌یە ، کورتەیەکە سەبارەت بە چۆنێتی دەستنوێژ و نوێژی پێغەمبەر ﷺ ، پێویستت پێی دەبێت لە ژیانی ڕۆژانەت دا ، بێ ئەویش ناتکرێت ، ئەو شتانەم تێدا کۆکردوونەتەوە کە بەڵگەی ( صحیح ) یان لە سەرە ، بەشێوە یەکی ئاسان وسووك ، بە شێوەیەك تێگەیشتن لێی ئاسان بێت بۆ موسڵمانان بەگشتی ، هەوڵی ئەوەش دەدەم دووریم لە هێنانەوەی بەڵگەکان بە کەمی نەبێت : لەو بابەتانە نەبێت کە زانایان تیایدا بۆچونی جیاوازیان هەیە ، چونکە هێنانەوەی بەڵگەکان هۆکاری درێژبوونەوەی بابەتەکەن ، ئەوەش پێچەوانەیە لە گەڵ ئەم کورتە خنجیلانەیە ، بەڵام بابەتەکانی تری نووسراوەکەم - مەبەستم : ئەو بابەتانەی کە زانایان تیایدا جیاوازیەکی وایان نی‌یە - بە لگەکانیان ناهێنمەوە ، لە بەر ڕوون و ئاشکرابیان ، و کەمی خیلاف تیایان دا ، جا بەپشتیوانی خوای پەروەردگار دەڵێم :

## ﴿ دەستنوێژ ﴾

1 ـ دەستنوێژ بریتییە : لە بەکار هێنانی ئاوی پاك بەسەر چەند ئەندامێکی دیاری کراودا ، کە خوای پەروەردگار دیاری کردوون ، و پێغەمبەری خواش ﷺ بۆی روون کردوونەتەوە ، خوای پەروەردگار فەرموویەتی : ﴿ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ إِذَا قُمْتُمْ إِلَى الصَّلاةِ فاغْسِلُواْ وُجُوهَكُمْ وَأَيْدِيَكُمْ إِلَى الْمَرَافِقِ وَامْسَحُواْ بِرُؤُوسِكُمْ وَأَرْجُلَكُمْ إِلَى الْكَعْبَينِ ﴾ (1) .

واتە : ئەی بڕواداران ئەگەر هەستان بۆ نوێژ ، ئەوا رووخەتتان بشۆن لەگەڵ هەردوو دەستتان تاکو ئانیشکەکانتان ، و دەستیش بهێنن بەسەرتاندا ، و قاچەکانیشتان تاکو قاپەرەقەتان بشۆن .

وە پێغەمبەری خواش ﷺ فەرموویەتی : " لا تُقبل صلاةُ أحدِكم إذا أحدث حتى يتوضأ " (2) .

واتە : نوێژی هیچ یەکێك لە ئێوە درووست نییە ، ئەگەر دەستنوێژەکەی بەتاڵ بووەوە ، تاکو جارێکی تر دەستنوێژەکەی نەشواتەوە .

(1) سورة المائدة : 6 .

(2) متفق عليه .

2 ـ **موسڵمانی بەڕێز** : ئەگەر هەستای بۆ دەستنوێژ شوشتن ئەوا نیازی ئەو کارە لە دڵتدا بهێنە ، بێئەوەی بە زمان بیڵێیت ، لەبەر نەهاتن و وارد نەبوونی بەڵگە لە پێغەمبەرەوە ﷺ لە سەر ئەو کارە ، پاشان ناوی خوا بهێنەو بڵێ : ( بسم الله ) ، لەبەر ئەو فەرموودەیەی کە پێغەمبەری خوا ﷺ تیایدا فەرموویەتی : " لا وضوء لمن لم يذكر اسم الله عليه "[3] .

واتــە : دەستنوێژەکەی تەواو نییە ئەو کەسەی کــە ( بسم الله ) نەکات لە سەرەتای دا

3 ـ پاشان هــەردوو دەستت سێجار بشوە ، و پــاش ئــەوەش سێجــار ئاو بدە بە دەمتدا ( المضمضــة )[4] ، پاشان سێجار ئاو بە لووتتدا بدە ( الإستنشاق )[5] و هەڵیشی مژە ، ئەم کردارەش بەدەستی ڕاست دەبێت ، و لە هەموو جارێکیش دا هنگی بکەوە ( الإستنثار )[6] ، کە ئەمەشیان بەدەستی چەپ ئەنجام دەدرێت ، هەموو ئەمانەش لە پێغەمبەری خواوە ﷺ واردن وسەلمێنراون .

---

(3) صحيح الجامع : 7444 .

(4) المضمضة : بریتییە لە شوشتنی دەم وتێوەردانی ئــــاو تیایدا .

(5) الإستنشاق : گەیاندنی ئاوە بۆ ناوەوەی لووت ، لــــە گەڵ هەڵمژینی بۆ سەرەوەی .

(6) الإستنثار : بریتییە لە دەرکردنەوەی ئاوی ناو لووت دوای هەڵمژینی .

4 ـ پاشان ڕوومەتت سێ‌جار بشۆرە ، سوننەتیشە بۆ پیاوان بەهۆی پەنجەکانیانەوە ئاو بکەن بەناو ڕیشیاندا ( التخليل ) ( 7 ) ، پاشان سێ‌جار هەردوو دەستت تا ئانشکەکانت بشۆرە .

5 ـ پاشان جارێك هەردوو دەستت بە سەر هەموو سەرتدا بهێنە ، لە بەر ئەو ئایەتە پیرۆزەی کە خوای پەروەردگار تیایدا فەرموویەتی : ﴿ وَامْسَحُواْ بِرُؤُوسِكُمْ ﴾ ، پێغەمبەری خواش ﷺ چۆنێتی ئەم دەست بە سەردا هێنانەی بۆ ڕوون کردووینەتەوە ، هەروەکو چۆن (عبدالله) ی کوڕی ( زید ) ﷺ لێ یەوە بۆی گێڕاوینەتەوە : " أن النبيَّ ﷺ مسح رأسهُ بيديه فأقبل بهما و أدبر ، بدأ بمُقدّم رأسه ثم ذهب بهما إلى قفاه ، ثمّ ردّهما إلى المكان الذي بدأ منه " ( 8 ) .

واتە : پێغەمبەری خوا ﷺ کە دەستی هێنا بە سەریدا لە پێشەوە دەستی پێکرد تاکو کۆتایی ، واتە لە پێشەوەی سەری دەستی پێکرد تاکو گەیاندنی بە پشتی سەری ، پاشان گەڕاندنیەوە بۆ ئەو شوێنەی کە لێیەوە دەستی پێکردبوون .

6 ـ پاشان دەست بهێنە بەگوێکانت دا ، حوکمەکەشیان هەمان حوکمی سەرە ، چونکە بەشێکن لێی ،

---

( 7 ) التخليل : بریتی‌یە لە گەیاندنی ئاو بۆ بنەوەی ڕیش .

( 8 ) متفق عليه .

لە پێغەمبەری خواوە ﷺ وارد و سەلمێنراوە کە فەرموویەتی : " الأُذنـــان من الرأس " (9) .

واتە : گوێکان بەشێکن لە سەر .

7 ـ پاشان هەردوو پێت سێجار بشووە ، سوننەتیشە پەنجە تووتەی دەستی چەپت بخەیتە ناو پەنجەکانی پێتەوە لەکاتی شووشتنیادا ( التدليك ) ، چونکە لە پێغەمبەری خواوە ﷺ وارد و سەلمێنراوە کە ئەو کارەی ئەنجام دابێ .

8 ـ ئـــا بـــەم شێوەیە هەمـــووی بە تەرتیب ( الترتيب ) و یەك لـــەدوای یەك پێکەوە ( المـــوالاة ) ئەنجام دەدەیت ، و ( الموالاة ) تیش بریتییە لە : بەدوای یەکدا شووشتنی ئەندامەکانی دەستنوێژ بێ‌ئەوەی ماوەیەکی فراوانیان بکەوێتە نێوان شووشتنی ئەنـدامێك لـە گـەڵ ئەندامەکـەی تـردا ، سـوننەتیش وایـە لـە هەموونەمانەدا بە ئەندامی ڕاستە دەست پێبکەیت ، لەبەر ئەو فەرموودەیەی کە دایکە ( عائشة ) ـ ڕەزای خوای لێ بێت ـ بۆمان دوگێڕێتەوە : " كان رسول الله ﷺ يحب التيامن في تنعله ، و ترجلـــه ، وطهوره ، وفي شأنه كُلّه " (10) .

---

(9) صحيح الجامع: 2762 .

(10) متفق عليه .

واتە : پێغەمبەری خوا ﷺ حەزی لە ڕاستە بوو ، لە پێڵاوکردنە پێ ، و لە پرچ داهێنان ، و لە خۆپاکردنەوەکانی ، و لە هەموو کردارێکدا .

9 ـ سوننەتیش وایە ئاو کەم بەکار بهێنرێت ، و زیاد ڕەوی تێدا نەکرێت ، ئەنجام دانی کردارەکانی دەستنوێژ یەکجار یەکجار ، و دووجار دووجار ، و سێجار سێجاریش لە پێغەمبەری خواوە ﷺ وارد و سەلمێنراون [11] .

10 ـ **موسڵمانی بەڕێز** : سوننەتیش وایە ـ دوای تەواو کردنی دەستنوێژەکەت ـ ئەم زیکرە بڵێیت : " أَشْـــهدُ أن لا إلــه إلا الله ، وأنَّ محمداً عبدُ الله و رسولُه ، ثم تصلي ركعتين ، دون أن تحـدِّث بهـا نفسك " [12] .

واتە : شایەتی دەدەم کە هیچ خوایەك نیە شایستەی پەرستن بێت ئیللا ( الله ) نەبێت ، و هیچ کەسێکیش نیە شایستەی شوین کەوتن بێت ئیللا پێغەمبەری خوا نەبێت ﷺ ( محمد )یش بەندە و نێرراوی خوای پەروەردگارە ، پاشان دوو ڕکات نوێژ دەکات ، کە نوێژی دەست نوێژی پێدەوترێت . وە لە سوننەتدا چەندەها زیکری تری پاش دەستنوێژ لە پێغەمبەری خواوە ﷺ واردن .

---

(11) [illegible]

(12) [illegible]

## ﴿ نـــــوێژ ﴾

1 ـ نوێژگەر ڕوو لە قیبلە دەكات ـ كە كەعبەی پیرۆزە ـ بەوەستانەوە ، بەهەموو لەشیەوە لە هەر كوێیەك بێت ( 1 ) ، لە گەڵ بوونی نیەتی كردنی ئەو نوێژەی كە ئەیەوێ ئەنجامی بدات لە دڵدا، لەو ڕووی حوكمەوە : ئایا نوێژەكە فەرزە یان سوننەتە ، لە ڕووی كاتیشەوە : ئایا نوێژەكە نوێژی بەیانیانە ، یان نوێژی نیوەڕۆیە ، یان نوێژەكانی ترە ، ناشبێ نیەتەكەی بە زمان بڵێت لە بەر وارد نەبوون ونەسەلماندنی ئەو كردارە لە پێغەمبەری خواوە ﷺ ، لە گەڵ دانانی سوترەیەك لە پێشیدا ( 2 ) ، بەتاك نوێژەكەی ئەنجام بدات یان پێش نوێژ بێت بۆ كەسانی تر ( واتە : إمـــام ) لەم كردارەشی شوێن كەوتەی ووتەی پێغەمبەری خوا دەبێت ﷺ كە فەرموویەتی : " لا تصل إلا إلى سترة ، ولا تدع أحداً يمر بين يديك ... " (3) .

واتە : نوێژ مەكە ئیللا ڕووەو سوترەیەك نەبێت ، ڕێگەش بە كەس مەدە بە بەردەستتدا تێپەر ببێت ... .

---

(1) جگە لە كاتی ترس و نەخۆشیدا بە پێی توانا دەبێت .

(2) سوترە : شتێكە نوێژگەر لە پێش خۆیدا دایدەنات ، لە دووری ڕێڕەوی شەكێك ، لە شوێنی سوژدەكەیەوە .

(3) [illegible]

2 - پاشان تەکبیرەی ئیحرام دادەبەستێت بەوەی کە دەڵێت : ( الله أكبر ) ، لە گەڵ تێڕوانینی بۆ شوێنی سوژدەکەی ، لە کاتی وتنی تەکبیرەی ئیحرام هەردوو دەستی بەرزدەکاتەوە تاکو ئاستی شانەکانی ، یان تاکو ئاستی گوێکانی ، هەردوو شێوەکەش وارد و سەلمێنراوە لە پێغەمبەری خواوە ﷺ ، پاشان دەستە ڕاستی لە سەر دەستە چەپی لە سەر سنگی دادەنێت ، هەر وەکو چۆن لەو فەرموودەیەدا واردبووە کە ( أبو دود و ابن خزيمة وأحمد ) بە سەنەدێکی ( صحيح ) دەیگێڕنەوە ، ئەو فەرموودەیەش کە پێچەوانەی ئەم فەرموودەیە بێت ئەوا ( صحيح ) نییە .

3 - پێویستیشە لە سەر نوێژگەر بیری لەلای نوێژەکەی بێت ( واتە : خشوعی هەبێت ) چاوەکانیشی بەئاسماندا نەگێڕێت ، و بە لای ڕاست و چەپدا چاو نەگێڕێت ، لە بەر نەهی کردنی پێغەمبەری خوا ﷺ لەهەموو ئەمانە .

4 - پاشان نوێژەکەی دەست پێدەکات بە یەکێك لەو زیکرانەی کە واردن لە پێغەمبەری خواوە ﷺ لەوانەش پێغەمبەری خوا ﷺ دەیفەرموو : " سبحانك اللهم وبحمدك وتبارك اسمك ، وتعالى جدك ، ولا إله غيرك " ، یان هەر زیکرێکی تر جگە لەم زیکرە .

5 ـ پاشان پەنا دەگرێت بە خوای پەروەردگار لە خراپەی شەیتانی دەرکراو لە رەحمەتی خوا ، و پاشان دەڵێت : ( بسم الله الرحمن الرحيم ) ، سوننەتیشە بە بێ دەنگی ( بسم الله ) بکات لەو نوێژانەی کە دەنگیان تیادا بەرز دەکرێتەوە ، چونکە فەرموودە( صحيح ) ەکان ئەوەمان بۆ دەسەلمێنن لە پێغەمبەری خواوە ﷺ ، و هاوەڵە بەرێزەکانی ـ رەزای خوا لە هەموویان بێت ـ .

6 ـ پاشان سورەتی ﴿ الفاتحة ﴾ بەتەواوی دەخوێنێتەوە ـ کە ( بسم الله ) ش ئایەتێکە لێ ی ـ ، سوننەتیش وایە ئایەت ئایەت جیا لە یەك بیانخوێنێ ، بەشێوەیەك لە کۆتایی هەموو ئایەتێك بوەستێ ( 4)

7 ـ پاشان ئەوەندەی کە لە توانایدایە لە گەڵ سورەتی ﴿ الفاتحة ﴾ دا قورئانی پیرۆز دەخوێنێتەوە ، سوننەتیش وایە لە رکاتی یەکەمدا زیاتر درێژی بکاتەوە تاکو رکاتی دووەم

8 ـ رێ پێ دراویشە لە شەرعدا بۆ ئەو کەسانەی کە لە پشت پێشنوێژەوە نوێژ دەکەن ( واتە : المقتدي و المـأموم ) ئەگەر پێشنوێژ خوێندنەکەی لە لا تێکەڵ بوو بۆی راست بکاتەوە ، یان لە کاتێکدا ئایەتەکانی لە لا تێکەڵ دەبێت ، چونکە ئەم کردارە رووی

---

[illegible]

داوە بۆ پێغەمبەری خوا ﷺ لە گەڵ هاوەڵە بەڕێزەکانی - ڕەزای خوایان لێ بێت - ( 5 ) .

9 - کە نوێژگەر لە خوێندنەوەی قورئان دەبێتەوە ، ساتێکی کەم بێدەنگ دەبێت ، پاشان دوو دەستی بەرزدەکاتەوە ، و ( الله أکبر ) دەکات ، پاشان کڕنووش دەبات بەشێوەیەك تاکو لەشی لە جووڵە دەکەوێ ، و دەستەکانی لە سەر ئەژنۆکانی دادەنێت و لێیانی توند دەکات ، لە گەڵ بڵاوکردنەوەی پەنجەکانی لە یەکتر وەکو ئەوەی بڵێی ئەژنۆکانی گرتبێ ، پشتیشی درێژ و پان دەکاتەوە ، و سەریشی لە ئاستی پشتی دادەنێت بەشێوەیەك نە نزمتری کردبێتەوە لە ئاستی پشتی نەش بەرزتری کردبێتەوە ، بەڵکو لە ئاستی پشتی دەیوەستێنێ .

10 - وە لە کڕنووشەکانیدا دەڵێت : ( سبحان ربي العظيم ) ، یان هەر زیکرێکی تر کە لە پێغەمبەری خواوە ﷺ وارلوو ، و سەلمێنراوبێت ، ئەوەش سێجار یان زیاتر ، وە ناشبێ نوێژگەر لە کڕنووش و سوژدەکانیدا قورئانی پیرۆز بخوێنێت .

11 - پاشان هەڵدەستیتەوە لە کڕنووشەکەی ، لە کاتی هەستانەوەکەشی دەڵێت : ( سمع الله لمن حمد ) لە گەڵ

---

[illegible]

بەرزکردنەوەی هەردوو دەستی ، کە ڕادەوەستێت و ڕێك دەبێتەوە ، دەڵێت : ( ربنا و لك الحمد ) ، یان هەر زیکرێکی تر کە لە پێغەمبەری خواوە ﷺ واردووەوسەلمێنراوبێت( 6 ) .

12 ـ پاشان خۆی بەردەداتەوە بۆ سوژدە بردن ، بەشێوەیەك دەستەکانی پێش ئەژنۆکانی بخاتە سەر زەوی ، لە بەر ئەو فەرموودەیەی کە پێغەمبەری خوا ﷺ تیایدا فەرموویەتی : " إذا سجد أحدكم فلا يبرك كما يبرك البعير،وليضع يديه قبل ركبتيه" ( 7 )

واتە : ئەگەر هەریەك لە ئێوە سوژدەی برد ، با وەکو ووشتر نەکات ، بەڵکو دەستەکانی پێش ئەژنۆکانی بخاتە سەر زەوی .

ئەو فەرموودانەش کە پێچەوانەی ئەمەبن ( ضعيف ) ن و کاریان پێناکرێت .

13 ـ پاشان سوژدە دەبات ، و متمانە دەکاتە سەر ناو لەپەکانی بە کراوەیی ، و لە گەڵ بەیەکەوە لکاندنی پەنجەکانی هەردوو دەستی ، و ڕووکردنیان لە قیبلە ، باڵەکانیشی نالکێنێت بە زەویەوە ، لەبەر بوونی نەهی لەو کردارە ، و نیوچاوان و لووتی لە زەوی جێگر دەکات لە گەڵ هەردوو چۆکەکانی ، لە گەڵ چەقاندنی

---

6 هەندێکیان ووشەی ( الشكر )ی بۆ زیاد دەکات کەچی هیچ بنەوایەکی نییە .

7 [illegible]

پەنجەکانی بە زەوی دا ، و دەڵێت : ( سبحان ربي الأعلــى ) سێ‌جار یان زیاتر .

14 ـ پاشان سەر بەرزدەکاتەوە و ( الله أكبر ) دەکات ، تاکو جەستەی لە جوولە دەکەوێت ، پێی ڕاستی ڕادەخات و لە سەری دادەنیشێت ، پێی چەپیش بە زەویدا دەچەقێنێت ، لەم دانیشتنەشی دەڵێت : ( ربِّ اغفر لي ) و دووبارەشی دەکاتەوە .

15 ـ پاشان جارێکی تر ( الله أكبر ) دەکات و دەچێتە سوژدەی دووەمەوە ، هەموو ئەو شتانەش تیایدا دووبارە دەکاتەوە کە لە سوژدەی یەکەمدا کردوویەتی .

16 ـ پاشان دانیشتنێکی کەم دادەنیشێ کە پێی دەوترێت ( جلسة الإستراحة ) ، دوای ئەوە هەڵدەستێتەوە بە متمانە کردنی لە سەر دەستەکانی کە بەستراون وەکو دەستەکانی هەویر شێل ، ئەوەش پێچەوانەی ئەوەبێت ، سەنەدی هیچیان ( صحیح ) نی یە .

17 ـ لە ڕکاتی دووەمیشدا هەموو ئەوانە ئەنجام دەدات کە لە ڕکاتی یەکەمدا ئەنجامی دابوو ، بەڵام زیکری دەست پێکردنی نوێژ دووبارە ناکاتەوە .

18 ـ کە لە ڕکاتی دووەم دەبێتەوە ، بەو شێوە دادەنیشێت کە لە خاڵی ( 14 )دا ڕوون کراوەتەوە ، کە پێی دەوترێت ( الإفتراش ) ، و دەستی ڕاستی لە سەر ڕان و ئەژنۆی ڕاستی دادەنێت ،

دەستی چەپیشی دەكاتەوەو لە سەر ڕان و ئەژنۆی چەپی دادەنێت ، پەنجەكانی دەستی ڕاستی دەبەستێت ، و پەنجە گەورەشی لە سەر پەنجەی ناوەڕاستی( واتە : پەنجەی هەڵمەقووتە ) دادەنێت ، و پەنجەی شایەتومانی ڕوو دەكات لە قیبلەو چاویشی تێ دەبڕێت ، و دەیجولێنێتەوە پێی دەپاڕێتەوە لە سەرەتای تەحیات خوێندنەكەی تاكو كۆتایی ، لە بەر جێگر بوون ، و واردبوونی ئەم كردارە لە پێغەمبەری خواوە ﷺ ، هەروەكو چۆن ( وائل ) ی كوڕی ( حجر ) ﷺ بۆی گێڕاوینەتەوە ، فەرموودەكەشی ( أبو داود و النسائي و أحمد ) لێیەوە دەیگێڕنەوە ، و ( ابن خزيمة و ابن حبان ) و جگە لەمانیش بە ( صحيح ) ی دادەنێن ، ئەوەش پێچەوانەی ئەمە بێت ئەوا ( شاذ )ە ، چونكە پێچەوانەی یەكێك لە گێڕەرەوەكانی هەمان فەرموودەیە ؛ وە پێچەوانە بوونەوەشە لە گەڵ كەسێكی ئەولاتر لە خۆی .

19 ـ تەحیاتەكەشی بە بێدەنگی دەخوێنێتەوە ، چەند شێوەیەكیشی هەیە لەوانە : " التحيات لله والصلوات و الطيبات ، السلام على النبي ورحمة الله وبركاته ، السلام علينا وعلى عباد الله الصالحين ، أشهد أن لا إله إلا الله ، وأشهد أن محمداً عبدُه ورسولُه " .

20 ـ پاشان صەلاوات دەدات لە سەر پێغەمبەری خوا ﷺ بە یەكێك لەو شێوانەی كە لە پێغەمبەری خواوە ﷺ وارد بووە ، لەوانەش : " اللهم صلِّ على محمد وعلى آل محمد ، وبارك على محمد

وعلى آل محمد ، كما صليت وباركت على إبراهيم وعلى آل إبراهيم ، إنك حميد مجيد" *.

22 ـ ئەگەر نوێژەکەی دوو ڕکاتی بوو ئەوا سەلام دەداتەوە ـ هەروەکو ئەوەی کە دێت ـ ئەگینا( الله أكبر ) دەکات و هەڵدەستێتەوە بۆ ڕکاتی سێیەم و دەستەکانی بەرز دەکاتەوە ، لەم ڕکاتەو لە ڕکاتی چوارەمیش دا چی لە ڕکاتی دووەمدا ئەنجام داوە تیایاندا ئەنجامی دەدات ، پێویستیشە لە هەموو ڕکاتێکدا سورەتی ( الفاتحة ) بخوێنێت

23 ـ پاشان دادەنیشێت بۆ خوێندنەوەی تەحیاتی کۆتایی ، چیشی لە تەحیاتی یەکەمدا ئەنجامداوە لێرەشدا ئەنجامی دەدات ، بەڵام شێوەی دانیشتنەکەی بەشێوەی ( التورُّك ) دەبێت ، کەبریتیە : لە دانانی پێی چەپی لە ژێر قاچی ڕاستی کە چەقاندوویەتی بە زەویدا ، پاشان تەحیات دەخوێنێت و صەڵاواتیش دەدات لە سەر پێغەمبەری خوا ﷺ ، بەو شێوەیەی کە لە خاڵی ( 18 )و ( 19 )و ( 20 )دا ڕوونمانکردۆتەوە ، پاشان پەنا دەگرێت بە خوای پەروەردگار لە چوار شت ئەوەش بەم شێوەیە : " اللهم إني أعوذ بك

* ئەم صەڵاواتە یان هەر صەڵاواتێکی تر بخوێنە کە لە سوننەت دا هاتبێ ، وەک : "اللهم صل على محمد وعلى آل محمد كما صليت على إبراهيم وعلى آل إبراهيم إنك حميد مجيد اللهم بارك على محمد وعلى آل محمد كما باركت على إبراهيم وعلى آل إبراهيم إنك حميد مجيد" ( وەرگێڕ ) .

من عذاب جهنم ، ومن عذاب القبر ، و من فتنة المحيا والممات ، ومن شر فتنة المسيح الدَّجال " ، پاشان هەردوعاو پاڕانەوەیەکی بەدڵبێ دەیکات

24 ـ پاشان سەلام دەداتەوە بۆ کۆتایی هێنان بە نوێژەکەی ، بە یەکێك لەم شێوانەی خوارەوە :

( أ ) ( السلام عليكم ورحمة الله وبركاتـــه ) بەلای ڕاستدا ، و( السلام عليكم ورحمة الله ) بەلای چەپدا .

( ب ) هەمان شێوەی یەکەم بە لابردنی ( وبركاته ) لە سەلامی یەکەم دا ، جگە لەم دوو شێوەیەش شێوەی تر وارده لە پێغەمبەری خواوە ﷺ .

**تێبینی : نوێژگەری بەڕێز** : ئەوە بزانە کە نوێژی پیاو و ژن هیچ جیاوازیەکیان لە نێواندا نییە ، لە بەر گشتێتی ئەو فەرموودەیەی کە پێغەمبەری خوا ﷺ تیایدا فەرموویەتی : " إنما النساء شقائق الرجـــال " [8] ، واتە : ژنان هاوشان و برای پیاوانن .ئیللا مەگەر جیاوازیەك بە پێی فەرموودەی ( صـــحيح ) ی پێغەمبەری خوا بێت ﷺ ( 9 ) .

---

(8) صحيح [illegible]

(9) هیچ فەرموودەیەکیش نەهاتوە لەو فەرموودانەی کە سەبارەت بە چۆنێتی دەستنوێژ و نوێژی پێغەمبەری خوا ﷺ باسم کردوون بکرێت بە بەڵگە بۆ ئەو جیاکاریە . بەڵکو هەندێك فەرموودە هاتوون لەو بارەیەوە ، بەلام هەموو ( ضعيف )ن ، و زانایانی فەرموودە و لێکۆڵەران ئەوەیان ئاشکرا کردووە .

## کۆتایی :

**برای موسڵمان :**

هەر ئەوەندەم پێکرا سوننەت لە سوننەتەکان پێغەمبەری خوا ﷺ بخەمە ڕوو ، لە **چۆنیەتی دەستنوێژ و نوێژەکەی** ، بۆ ئەوەی ڕوون بێت لە لای تۆی بەڕێز ، بۆئەوەی شێوەکەی لە مێشکتدا بێت ، هەر وەکو ئەوەی لە پێش چاوتدا بێت و بەچاوی خۆت بیبینی - إن شاء الله - جا ئەگەر تۆ بە شێوەیەکی نزیك لەم شێوەیەی پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژەکەت ئەنجامت دا ، ئەوا داوالکارم لە خوای پەروەردگار نوێژ وهەموو کردەوە چاکەکانت لێ وەرگرێت ، چونکە بەو کردەوەت ئەو فەرموودەیەی پێغەمبەری خوات ﷺ بەجێهێناوە کە فەرموویەتی : " صَلُّوا كما رأيتموني أُصلي " (10) .

واتە : نوێژەکانتان ئەنجام بدەن هەر وەکو چۆن منتان بینیوەنوێژ ئەنجامی دەدەم .

**لە نووسینی** : ( أبو الحارث علي بن حسن بن علي ) ، لە ڕۆژی پێنجەمی مانگی ( صفر ) ی خێر لە ساڵی چوارەم پاش هەزارو سەد لە کۆچی پێغەمبەر ﷺ ، لە (الزرقاء ) لە ( الأردن ) .

**لە وەرگێڕانی** : بارکی عبدالله کەلاری - لە ساڵی 1425 لە کۆچی پێغەمبەری خوا ﷺ لە مەککەوە بۆ مەدینە ، لە ( کەلار - کوردستان - العراق ) .

وآخر دعوانا أن الحمد لله ربِّ العالمين .

---

(10) رواه البخاري .